# جەماوەر لە وتاری میدیایی دا

نووسـینی: ناصر فوراسـانی

وا دیارە ئوممەت لەمڕۆدا لە جەبریەت ودیکتاتۆریەتێکدا دەژی کە تەواوی مافەکانی ژیانی لێ زەوت کردووە، سەرەتا لە مافی ژیانی دا لە ژێر سێبەری شەریعەتی ئیسلام - لە هەر ڕوویەکی ژیاندا بێت - وەك ئوممەتێکی موسوڵمان، لە دادگاوە بۆ مزگەوتەو، قبووڵ نەکردنی هەر یاسایەکی دەستکردی پێچەوانەی شەرع وئاینەکەی، تا دەگات بە مافی دا لە دەستنیشانکردنی دەسەڵاتدارانی لە ڕێی ئەهلی حەل وعەقدەوە، کە زانایان وپیاو ماقووڵانی ساڵح ولێهاتووی نێو خەڵکنەو، تاوەکو مافی بەکارهێنان وسوود بینینی لە سامانەکانی وڵاتەو، مافی فێربوون وزانست وهەلی کار ونەهێشتنی بێ کاریەو، وتا دەگاتە مافی قبووڵ نەکردن ورەت کردنەوەی دەسەڵاتی خۆسەپێنی ڕۆژئاوایی بەسەر ئوممەت دا وتاڵانی خێر وبێر وسامانەکانی.

هەموو ئەو مافانە زەوت کراونەو، لە هەمان کاتیشدا کلیلی کۆکردنەوەی ئوممەت وبووژاندنەوەی بیر وهزری ئوممەتن، بۆ ئەوەی دەنگی بەرامبەر بە ملهوڕ وتاغووتان وبەرامبەر زاڵیەتی وخۆسەپێنی دا بەرز بێتەوە.

بۆ ئەوەی گەلان قبووڵی هەر جەماعەتێك بکەن وبە بابەتەکانی قانیع بن، پێویستە هەوڵی ئەو کۆمەڵە بۆ گەڕاندنەوەو گێڕانەوەی مافەکانی لە دەست زاڵمان ببینن‌و، چارەسەری کێشەکانی ئەو گەلە لە هەوڵەکانیاندا بە دی بکەن، کاتێکیش ئەو جۆرە هەوڵانەیان لێوە بە دی کردن ئامادەی ئەوەن هەر چی هەیانە لە ڕێڕەوی بەدی هێنانی ئامانج ومەبەستەکانی

ئەو کۆمەڵ وجەماعەتەدا بەختیکەن وپێشکەشی بکەن، کە هەمان ئامانج ومەبەستەکانی ئوممەت وپرۆژەی ئوممەتن.

وتاری میدیاییش ئەو پردەیە بیر وڕاکان لە ڕێیەوە دەپەڕنە لای گەلانو، هەر کات وتارەکە لە باسکردن وخستنەڕووی پرس وکێشەی گەلەکان سەرکەوتوو بوو وتوانی چارەسەر گونجاوەکانیان بۆ دەستنیشانکات، بێ گومان لە یەکەم وگرنگترین شەڕەکانیدا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە؛ واتا کۆکردنەوەی ئومەت بە دەوری پرۆژەی ئەو کۆمەڵ وجەماعەتەی پێی قانیع بووەو پەسەندی کردووە.

لەوانەیە جەماعەت بازنەی ململانێکە لە سنووری چەسپاندن وتەحکیمی شەریعەت دا تەسك کاتەوە، ئەگەر چی مەسەلی حوکمی شەریعەتیش یەکێکە لە گرنگترین پرسەکان وخاوەن پێگەو بایەخێکی زۆرە، بەڵام گەلان پێویستیان بە تیشك خستنە سەر کۆمەڵێك پرسی وردی تر هەیە، بۆ ئەوەی بەرەو ڕیزی پرسە جیهادییەکە ڕاکێشرێنو، قوربانی دانیان بۆ هێنانە دی ئەو مەبەستە پێ قبووڵ بێت وبەرگەی کاردانەوەکان بگرن.

گەلەکان بەردەوام لەگەڵ ئیسلام وشەریعەت وڕێساکانی دان، بەڵام کێشە لەو دەسەڵاتدارەیە کە لە ئەنجامی دواکەوتنی شارستانیەتی ڕۆژئاواو سەرانی خۆسەپێنی ڕۆژئاواییەوەو، لە بەرامبەر مانەوەی لە کورسی دەسەڵاتدا یاساو ڕێسا پێچەوانەکانی ئیسلامی داناوەو سەپاندووە، بەڵام گەلەکان بە سروشتی خۆیانەوە لەگەڵ تەحکیم وچەسپاندنی شەریعەتدان، بۆیە برنارد لویس لە کتێبێکیدا بە ناوی "زمانی ئیسلامی سیاسی"یەوە دەڵێت: "هێشتا ئیسلام بۆ زۆربەی موسوڵمانان پەسەندترین بنەماو ژێرخانەکانی دەسەڵاتە، یاخود تاکە بنچینەو بنەمای قبووڵکراوە لە ڕاستیدا لە کاتی کێشەو تەنگژەکاندا، هیچ دەسەڵاتێکیش توانای ئەوەی نییە هێز وقودرەتی سیاسی لە مەجالێکی بەرفراوان دا هەبێت

وبۆ ماوەیەکی زۆر درێژدا زاڵ بێت؛ مەگەر حوکمەت ودەسەڵاتەکە شەرعیەتی خۆی لە ئیسلامەوە وەرگرێ، پتر لەوەی لە بانگەشەی میللی ونیشتیمانی ویاخود بیرو ڕای ڕۆژئاواییەوە بەدەستی بێنێت. بۆیە ئیسلام تاوەکو ئێستاش فراوانترین پێکهاتەی بیر ودید وتێڕوانین لە ژیانی سیاسیدا پێشکەش دەکاتو، تێگەیشتووترینیانە لە دەرك کردنی بە پێوانە ونەریتە کۆمەڵایەتییەکان. هەروەها ئیسلام سیستمێك لە بەها لە یەکێك لە کاراترین سیستمەکان بۆ مەبەستی داگرتنی سیاسی فەراهەم دەکات".

هەر بانگەشەیەکیش بۆ ئەوەی هەڵسێتە سەر پێ پێویستە دژەکەی پووچەڵکرێتەوە، بۆیە ناکرێ جیهاد وچەکداری وەك چارەسەری کێشەو تەنگژەکان بسەلمێنرێت، تا نەیسەلمێنین دیموکراسی وپەرلەمانەکان چارەسەر نین.

بگەڕێینەوە واقیعی ئێستاش، خەڵکانی چاودێر دەرکی ئەوە دەکەن کە گەلان لە هەر کاتێکی گوزەشتەی پێشترەوە زیاتر ئامادەی قبووڵکردن وپەسەند کردنی بیرۆکەی جیهادن، چونکە دیکتاتۆریەت وسەرکوتکردن وخۆسەپێنی لە هەر قۆناغێکی تری گوزەشتە بە هێزتر وسەختتر بووەو، دیموکراسی وسیاسەتی ئاشتیانەی گێڕانەوەی مافەکان وبەشداریکردن لە پەرلەمانیش شکستی خۆی سەلماند وچیتر گەلان متمانەیان بەو ڕێڕەوە نییە، ئەوەش زیادکە کە ڕژێمی نێودەوڵەتی لەمڕۆدا ڕووی ڕاستەقینەی خۆی بەدەرییێخستووەو، توخمگەری دژ بە ئیسلامیش لە ئاستی سەرانی دەسەڵاتی ڕۆژئاوادا ئەمڕۆ دەدرکێنرێت - جگە لە ئەندامانی ئاسایی کۆمەڵگا -، بۆ ئەوەی لە مەبەستیشم بگەیت ئەوەندە کافییە بزانیت کە ئەندامێکی دامەزرێنەری یەکێك لەو تۆڕانەی کاریان لەسەر بڵاوکردنەوەی ڕق وکەراهیەت دژ بە موسوڵمانان لە ئەمریکا دا دەکرد، کە "ستیف بانون"ە؛ ئەمڕۆ بەرپێوەبەری ستراتیژیەکانی کۆشکی سپییە لە ئیدارەی ترامپ دا.

بۆیە دەتوانین بڵێین کلیلی ململانێکە ئەمڕۆ زۆر بوونە، بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوودا کە سنووردار وژمێرراو بوون، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە فەزایەکی گونجاو ومافی خۆیان لە وتاری میدیاییدا وەرنەگرتووە، تەنها کیفایەت بە یەك جۆریان کراوە.

لە هەمان ئەو کاتەی ڕوو لە گەلان دەکەین وداوایان لێ دەکەین هەستنە سەر پێ وبەشدارمان بن لە جیهاد ولادانی تاغووتدا بۆ چەسپاندن وتەحکیمی شەریعەت، پێوستە ڕوویان تێ بکەین وپێیان بڵێین کە ئەو دەسەلاتدار وئەو زاڵمەیە هۆکاری هەژاری ونەدارییانەو، ئەوە کە سامان ودارایيەکانیان تالآن وفەرهوود کردووەو مافەکانی زەوت کردوونو، بە جیهاد کردن دەتوانین مافە زەوت کراوەکانیان بگێڕینەوە. هەروەها دەتوانین بەو وتارەوە ڕوو لە گەلەکان بکەین کە ئەو حاکمە زۆردارە بەردەی فەرمانی ڕۆژئاوايەو، لە کەرەستەیەکی نا ڕاستەوخۆی کۆلۆنیالیزمی ڕۆژئاوایی زیاتر نییەو، وڵاتەکانیش هێشتا لە ژێر داگیرکاری دان، بەڵام نەك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەڵکو لە ڕێی بریکارەکانیان کە خەڵکی خۆماڵی وناوەوەی خۆمانن.

واقیعیش پێمان دەڵێت کە هیچ کات ڕژێم وحیزبەکان وەك ئەمڕۆ نەڕووخاون وڕووی ڕاستەقینەیان ئاشکرا دەرنەکەوتووە، بەڵام هەر واقیعیشە ئەوەمان پێ دەڵێت کە کەس نییە ئەو داڕووخانە بقۆزێتەوەو پەردەی ڕژێمەکان هەڵداتەوەو گەلان لە ڕاستی تاغووتەکان هۆشدارکاتەوە، چونکە جەماوەر زۆر جار پێویستیان بە هاندانێکە بۆ ئەوەی دەرك بە ڕاستییەکان بکەن.

بۆیە شیخ رفاعی سرور - ڕەحمەتی خوای لێبێ - لە کتێبی "دید وتێڕوانینی سیاسی بزاڤی ئیسلامی"دا دەڵێت: "جەماوەر پرسی خۆی هەیەو، یەکەمیان خۆراك وئاسایشە، بایەخدانیش بەو پرسانە لە کاتی ڕووکردنە جەماوەر لە وتاردا مەسەلەیەکی پێویستو واجبە، چونکە

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ – إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ – فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ – الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ} (لەبەر ئەوەی قورەیش هۆگر بووە - خۆی گرتووە بە کاروانی زستانەی (یەمەن) و کاروانی هاوینەی (شام) بۆ بازرگانی و (دابین کردنی بژێوی) - کەواتە با پەروەردگارو خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە (کەعبە) بپەرستن - ئەو زاتەی لەبرسێتی ڕزگاری کردن و خۆراکی پێبەخشین و لە ترس و بیمی (جەردە و ڕێگران) پاراستوونی و ئاسایشی بۆ دابین کردوون)، بەڵام ئەوەی قبووڵ نەکراوە زۆریش قەدەغەیە ئەو داواکارییە دارایی وئابووریانەی جەماوەر بە شێوەیەکی جیا لە پرسی سەرەکی بانگەوازەکە لە خۆ بگرێن وپێداگیرییان لەسەردا بکرێت، کە پرسی عەقیدەو بیر وباوەڕ ویەکخواپەرستییە، بۆ ئەوەی پەیڕەوی بانگەوازەکە بە ئاڕاستەیەکی ئابووری وداراییدا نەڕوات بە شێوەیەك کە کاریگەری بخاتە سەر دیمەن ودیدە خوداوەندییەکەی".

کەواتە شێخ لێرەدا باسی بایەخنەدان بە لایەنێك ونوقم بوونە لایەنێکی تر دەکات، بەڵکو پێویستە کە هاوسەنگییەك لە نێوان پرسەکاندا هەبێت وبە یەکەوە ببەسترێنەوە.

تۆ خاوەن پرۆژەیەکیت مەبەست لێی بووژاندنەوەی ئوممەت وگێڕانەوەی دەوڵەتێکی ئیسلامی سەر ڕاست وڕاشیدە، لەسەر بنەمای شوورا وڕاوێژ ودادپەروەریدا پێکهاتبێت، بەڵام چیت پێشکەش بە جەماوەر کردووە بۆ ئەوەی پرۆژەکەتیان لا پەسەند بێ ! خەڵك بە دوای وردەکاری وبنەماکانی پرۆژەکەتدا دەگەڕێن تا قەناعەت بە بانگەوازەکەت بکەن، بەوەی بانگەشەی بۆ دەکەیت وئاخۆ ڕوخساری ئەو سیستەمە سیاسییەی لە بەرنامەتدایە پێکی بێنیت چۆنە ؟ ئایا شێوازی حوکمەت چۆن دەبێتو ؟ پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەری بە چ شێوەیەك ئەبێو ؟ ... هتد.

هەموو لە ڕۆشنگەری ونووسین تیۆری دارِشتن لە بابەتەکانی عەقیدەو بیر وباوەڕ وتەحکیم وچەسپاندنی شەریعەت دا بەشدار بووەو، کتێبخانەی جیهادی وەختە پڕی نووسین وبابەت بێ

سەبارەت بەم پرسە، هەموو ئەوەش بنچینەیەکە کە بینای لەسەر دەکرێتو، ناکرێ لە بایەخی ئەم جۆر دانان ونووسینانە کەمکەینەوە، بەڵام لە بەرامبەردا کوا ئەو کتێبانەی باس لە شێوەو شکڵی دەوڵەتی ڕاشید وسەرڕاست دەکەن ؟ وکوا ئەو کتێبانەی باسی پیلانە ستراتیژییەکان دەکەن ؟ کوا سەنتەر وناوەندەکانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە کە بایەخ بەو وردەکارییانە دەدەن کە لە دەوروبەری جیهاندا بەڕێوە ئەچنو دەیانخوێننەوەو بینایان لەسەر دەکەن ؟

---

لە هەفتەنامەی مەسرا – ژمارە ٤٥



پێگەی ئیسلامی گزنگ

Facebook: @Gizing.net
Telegram: @Gizing_net

2017-1438